ڕاستییەکان لەســەر

# أبو حنيفه

# و

بەرگرییەک لە مەنهەجی خەلەف


نوسینی

مامۆستا محمد عمر

ئامادەکردنی

خـادم الإســـلام



١٤٤١ کۆچی/ ٢٠٢٠ زاینی

# ناوەڕۆک

بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەکی:

بەیارمەتی و پشتیوانی الله چەند لاپەڕەیەک لەسەر ڕاستییەکان دەربارەی "أبوحنیفه" باسدەکەم و، باسکردنەکەشم هەر لە سەلەف تاوەکو خەلەف مەدح و زەمەکان، هەروەها ڕاستی باسەکان چۆنە و چۆن نییە و، بۆچی ئەمڕۆ تەکفیری دەکەن و ئامانج لە دەرکردن و نوسینی کتێب، ئایا تەنیا بۆ تەکفیری "أبوحنیفه"یە یان پوچەڵکردنەوە و تەکفیری ناڕاستەوخۆی مەنهجی خەلەفی شوێنکەوتەی سەلەفە تا ئەم ساتەش؟

باسەکە زۆر درێژەی پێنادەم، بەڵام خستنەڕووی دیوە ڕاستییەکەیە وەک خۆی و، ئایا هۆکاری زەمی سەلەف بۆ "أبوحنیفه" چی بووە؟ ئایا وەک دەڵێن سەلەف بەکۆڕا تەکفیریان کردووە و، ئایا سێ ئیمامەکە تەکفیریان کردووە؟ واتە هەریەک لە "مالک" و "شافعی" و "أحمد"، لەبەرئەوەی ئەم سێ پێشەوایە سەلەفن .

✍ مامۆستا محمد

واتە لەسەردەمی خۆی و دواتر بەڵام با لاتان ڕوون بێت ئێمە لەم باسانەدا تەنیا پشت بە سەنەد ئەبەستین و، وەک بیرهێنانەوە بۆ برا و خوشکی ئیماندارانمان، ئێمە لەزانستی فەرموودە لەسەر سەنەد چەند پلەیەکمان هەیە. یەکەم پلە و صەحیحترین سەنەد سەنەدی ئیمامی "بوخاری"یە رحمە الله چونکە تەنیا پشتی بە (سمع) بەستووە، واتە گوێ لێبوون واتە ئەم کەسە دەبوایە لەهەمان سەردەم بژیایا و خۆشی گوێی لێبوایە، بۆیەش لە حەدیث صەحیحترین کتێب کتێبی ئیمامی "بوخاری"یە. ئنجا دەمەوێت بەشێک لەو سەنەدانە بەراورد بکەین، ئایا (سمع) یان سەردەم یان قال فلانە بەیارمەتی الله تعالی.

باسی "أبوحنیفە" هەر لە سەلەف تا ئەمڕۆش جەرح و تەعدیل کراوە، (جرح) واتە تۆمەتبارکردن و خستنەپاڵ بەشتێکە یان درۆیە یان بیدعەیە یان شتێکە کە تاوان بێت. هەندێک حاڵەت کوفرە بۆ بیرهێناوە بۆ ئیماندار عیلمی جەرح و تەعدیل یەکێکە لە عیلمە ئاڵۆز و ورد و بەرزەکانی بواری حەدیث گەر ئەم عیلمە نەبوایە نەمان دەزانی کام فەرموودە ڕاستە و کامیش دروست. ئەم زانستە لەسەرەتا وجودی نەبووە دواتر وردە وردە پەرەی سەندو تا سەردەمی "مالك" و دواتر "یحیی بن

سعيد القطان" و "على أبن المدينى" و "يحيى بن معين"، ئەمانە عالم بوون لەم عیلمە وەک "يحيى بن معين" کە لەسەردەمی ئیمامی "أحمد" بووە و، یەکێک بووە لە زانا هەرە بەرزەکانی عیلمی جەرح و تەعدیل، هەروەها ئیمامی "بوخاری" و دواتر ووردە ووردە پەرەی سەند. بۆنمونە ڕاوییەک جەرح کراوە بە (تدلیس)، دواتر تەعدیل کراوە واتە وەڵامی دراوەتەوە، ئایا ڕاست بووە یان نا. بابەتی تەکفیری "أبوحنیفە" کاتێک کە جەرح کراوە، لەبەرامبەری تەعدیل کراوە، بۆنمونە کەسانێ هاتوون کتێبیان لەسەر نوسیووە و تەکفیریان کردووە منیش دێم تەعدیلی دەکەم. بۆیە طالب العلم دەبێت سەیری حوججەی هەردوولا بکات کامیان بەهێزتر و دروست (صواب) تر بوو لە حەق ئەمیان بگرێت.

ئەو کتێبانەی کە لە باسی "أبحنیفە"ی تێدایە:

- كتاب السنەی عبدالله بن أحمد بن حنبل.
- كتاب الرد على الجهميەيی ئیمامی بخاری.
- مصنف ابن ابی شیبة، لەکتێبێکی تایبەتدا بەناوی الرد على أبی حنیفە.

 خطیب البغدادی که ئەمە بە سەلەف دانانرێت. چونکە ساڵانی چوار سەدی هیجری بووە و ألالكائی و هەندێکی تر.

گرنگترینیان کتاب السنەی ئیمامی "أبی عبدالرحمن بن أحمد"ە، کە زۆرترین قەولی لەسەر هێناوە کە لە تەسەلسولی ژمارە ٢٢٧ و، دەست پێدەکات لە ٤١٠ کۆتایی دێت لە موجەلەدی یەکەم واتە نزیکەی دووسەد قەول، بەڵام زۆرێکیان ئیسنادیان لاوازە و (مجهول الحال)ی زۆر تێدایە و زۆریشیان صەحیحە، بۆیە من دەمەوێت قەولی سەلەفی سەردەمی "أبوحنیفە" و دواتر لەم کتێبە وەک خۆی نەقڵ بکەم، بەڵام بەڕوونکردنەوە چونکە ئەوانەی کتێبیان لەسەر نوسیووە و جەرحیان کردووە ئەمڕۆ هاتوون خۆیان بە تێگەیشتنی خۆیان شەرحیان بۆ کردووە، (واتە هاتووە قەولی سەلەفی نەقڵ کردووە، بەڵام بەتێگەیشتنی خەلەف واتە بەتێگەیشتنی خۆی!) هەر بەمە ڕەددی خۆی داوەتەوە، چونکە ئەو دەڵێت مەنهەجی سەلەف و خەلەف زۆر لێک دوورن لەمەش ڕاست ناکەن، کە دواتر ڕوونی دەمەکەمەوە.

ئەوەی بۆ من گرنگە سەلەف لەکاتی نوسینی کتێبیان یان هێنانی قەولی بەشێکی کەم لەسەلەف لەسەری، بەڕێزەوە هاتوون ناویان

هێناوه. بۆنمونه "عبدالله بن إمامی أحمد" دەڵێت: "أبی حنیفه"، ناڵێت کافر و مورتەد و تۆپی! وەک ئەمانەی ئەمڕۆ که هەموو سنورێکی ئەدەبیان بەزاندووه.

- یەکەم قەولی کتاب السنەی "عبدالله بن أحمد":

به ژماره ٢٢٧ دەڵێت: گوێم لەباوکم بوو دەیووت "عبدالرحمن بن مهدی" دەیووت لەچاکی زانسی پیاو ئەوەیه سەیری رەئی "أبی حنیفه" بکات، ئیسنادی (صەحیحه). چونکه لەباوکی که ئیمامه دواتر "بن مهدی" که قوتابی "سفیان الثوری"ه و جێ متمانه (ثقة) و بەڵگه (حجة)یه و یەکێکه له پێشەوایان (أحد الأئمةیه).

- دووەم قەول به ژماره ٢٢٨ بەرگی یەکەم:

"عبدالله" دەڵێت: پێمان ڕاگەیەنرا که له "إسحاق بن منصور الکوسج": دەڵێت، گوتم به "ئەحمد بن حنبل" یەکێک پاداشت وەردەگرێت لەسەر ڕق لێبوونەوەی "أبوحنیفه" و هاوڕێکانی؟ فەرمووی بەڵێ.

**★ ئەم قەوله له ئیسنادی مەجهولی تێدایه ئەوەی که هەواڵەکەی به "عبدالله" داوه.**

کەچی ئەمڕۆ دێن پشتی پێ دەبەستن، دەڵێن ئەها ئیمامی "ئەحمد" وا دەڵێت.

- له قەولی دواتر بەژمارە (٢٣١-٢٣٢):

لەبارەی "ئەبو یوسف"ە کە دەڵێت بەجەهمی مردووە! بەڵام ئەم قەولەی "ئەبو یوسف" ئیمامی "البیهقی" لە کتاب الأسماء والصفات لەلاپەڕە (٢٥١) بە قەولێکی سەنەدی خۆی لە "ئەبو یوسف"ەوە کە پرسیاری لێدەکەن، ئایا "ئەبوحنیفە" گوتوویەتی قورئان مەخلوقە؟ دەڵێت پەنا بە الله و منیش واناڵێم. ئایا بیروڕای هەمان بیروڕای جەهمە؟!! دەڵێت پەنا بە الله و منیش واناڵێم.

کەواتە منیش دەڵێم لەکتێبێک جەرح کرابێت لەکتێبێکی تر تەعدیل کراوە و، لە قەولی ژمارە ٢٣٤ دەڵێت: پێی ڕاگەیاندم "أبو الفضل الخراسانی" لە "حسن بن موسى الأشیب"دا دەڵێت: گوێم لێبوو "ئەبو یوسف" دەیووت "ئەبوحنیفە" شمشێری دەوێت؟ منیش وتم: ئایا تۆش پێت وایە وتی پەنا بە الله! ئیسنادی صەحیحە، واتە دیفاعی لێدەکەن.

لە قەولی دواتر ژمارە ٢٣٥ لە "إسماعیل بن حماد بن ابی حنیفە" دەیووت ئەمە دینی ئەو باپیرانیە. واتە (القرآن مخلوق)ە. ئیسنادی لاوازە

بەهۆی "إسماعیل بن حماد بن أبی حنیفه". وەک لەسەرەتادا باسم کرد نزیکەی دووسەد قەولە، بۆیە ناکرێت دانە بەدانە باسی بکەم، بەڵام ئەم باسانە لە کتاب "السنەی عبدالله بن أحمد" هاتووە، بۆیە من ئەوانەی پێویستن دایان دەنێم و قسەیان لەسەر دەکەم بەیارمەتی الله.

**ئەقوالی "حماد بن سلمة" لەسەر "أبوحنیفه".**

- هەر لە کتاب السنەی "عبدالله بن أحمد":

سێ قەولی دەوێت هێناوە کە ئەمڕۆ ئەو دەست و ئەم دەستی پێدەکرێت بەوەی دەڵێن ئەوەتا تەکفیری "أبی حنیفه"ی دەکات، وەک بیرهێنانەوە قەولی "حماد بن سلمه" گرنگە، چونکە یەکێکە لەزانا حوججەکانی سەلەفی ئێمە. لە قەولی ژمارە (٢٣٩)دا لە "سفیانی الثوری"ەوە، دەڵێت: "حماد" پێی وتم بڕۆ بۆ لای ئەو کافرە، واتە "ابی حنیفه" گەر تۆ دەڵێیت قورئان مەخلوقە نزیکمان مەبەوە. لە ئیسنادی مەجهولی تێدایە بەمەش جێگیر (ثابت) نابێت.

- هەروەها لە قەولی ژمارە (٢٤١)دا:

"سفیان الثوری"دەڵێت "حماد" پێی وتم، ئایا سەرت نەسوڕماوە لە "ابی حنیفه" دەڵێت قورئان مەخلوقە. پێی بڵێ، ئەی کافر ئەی زەندیق.

بەڵام خەلەل لە ئیسنادەکەی هەیە. ئەمانیش هەریەک لە "إسحاق بن ابی یعقوب الطوسی" و "سلیم بن عیسی المقرئ" لەسەر "سلیم عقیلی" لە (الضعفاء)دا، دەڵێت: مەجهولە و نادیار (منکر)ە.

ئەم قەولانەی سەرەوە کە خەلەل لە ئیسنادیان هەیە و وەڵامیش دراوەتەوە کە "خطیب البغدادی" لە کتاب التأریخ لە ١٣، لاپەڕە ٢٨٥ (قال النخعی حدثنا أبو بکر المروذی)، دەڵێت: گوێم لە "أبو عبدالله أحمد بن حنبل" بوو کە دەیوت بۆمان ڕاست نەبووەتەوە کە "ابی حنیفه" وتبێتی قورئان مەخلوقە. بۆیە با طالب العلم خۆی بڕیار بدات لە مەسائیلێکی وا گرنگ دەبێت زۆر وردتر و هۆشیار تر بێت.

### - ئەقوالی ئیمامی "ئەوزاعی" لەسەر "أبی حنیفه":

لە کتاب السنەی "عبدالله بن أحمد" دە قەولی لە "ئەوزاعی"یەوە هێناوە لەسەر "أبی حنیفه" کە لە ٢٤٢ تا ٢٥٢ کۆتایی دێت. بەشێکیشی لاوازن ئەوەی جێگای ئیعتیبارە بۆم ئیمای "ئەوزاعی" نەک تەکفیر، بەڵکو تەبدیعیشی ناکات و، ڕەخنەی ئیمامی "ئەوزاعی" ئەوەبوو کەوا دەڵێت: ئصولی ونکردووە "ئەبو حنیفه" شوێن قیاس کەوتووە، بۆیە پێیان دەڵێن (أصحاب الرأي). هەروەها شیخ الإسلام "إبن تیمیه" رحمه

الله له (مجموع الفتاوى)دا لەبەرگی ٢٠ لاپەڕە ٣٠٤-٣٠٥ وەڵامی ئەوەی داوەتەوە بەوەی هەریەک واگومان ببات کەوا "أبی حنیفه" و غەیری ئەو لەپێشەوایانی موسڵمانان، کەوا پێچەوانەی حەدیثی صەحیح بجوڵێنەوە بە قیاس و شتی تر ئەوا هەڵەی کردووە، قسەش دەکات یان بەگومان یان بە هەوای نەفس، إنتهی.

هەروەها هەر لە (مجموع) و هەمان بەش و لاپەڕە دەڵێت: هۆکاری ئەوەی زۆر پشتی بەقیاس دەبەست زۆرێک لەباسەکانی پێنەگەیشتووە بەمەش لۆمە ناکرێت. لەبابەتەکانی داهاتوودا هۆکاری قیاسیش باسدەکەم.

- ئەقوالی "سفیان الثوری" لەسەر "أبی حنیفه":

لە کتاب السنەی "عبدالله بن أحمد" نزیکەی ٢٧ ئەقوالی هێناوە لەلایەن ئیمامی "سفیان الثوری" کە لە (٢٦٤)وە دەست پێدەکات، لە (٢٩١)دا کۆتایی پێدێت. هەریەک لە قەولەکانی ٢٦٤ و٢٦٦ و٢٦٧ و ٢٦٨ هەتا ٢٧٢ تەنها لەسەر یەک شتە ئەمیش ئەوەیە دەڵێت "أبو حنیفه" دووجار لەسەر کوفر تۆبەی کردووە، یان پێی کراوە ئەمەشیان بناغەی لەسەر دانانرێت زۆر ئاسابیە. یەکێک گوناهو کوفر بکات و دواتر تەوبە

بکات، وەک لەزۆرینەیەوە نەقڵ کراوە کەوا تۆبەی کردووە. هەروەها لە قەولی ژمارە ٢٦٥ عبدالله دەڵێت گوێم لەباوکم بوو کەوا دەیووت (واگومان دەبەم) کە "ئەبو حنیفە" لەم ئایەتەدا تۆبەی پێکرابێت (**سبحان ربك رب العزة عما یصفون**). ئەمەشیان حوکمی لەسەر جێگیر نابێت چونکە گومانە و، وەڵامی ئەم قسەیەش ئەوەیە کەوا هەر خودی ئیمام "أحمد" دەڵێت: بەجێگیری و ثابت بۆمان نەهاتووە کە "أبو حنیفە" گوتبێتی قورئان مەخلوقە.

### - ئەقوالی "مالك بن أنس" یان "إمام مالك" لەسەری:

پێنج قەولی هێناوە "أبی عبدالرحمن" کە لە ٢٩٢ دەست پێدەکات و لە ٢٩٦ کۆتایی دێت هەر پێنج قەولەکەی ئیمامی "مالك" ڕەخنەگرتنە لەسەری بەوەی شوێن قیاس کەوتووە و، ڕەئی زیاتر نەک تەکفیری بکات و بێت و بڵێت مورتەدە وەک ئەوانەی ئەمڕۆ قەولی سەلەف دێنن. بۆنمونە دێن دەڵێن ئیمامی "مالك" دەڵێت: گوتوویەتی (کاد الدین ومن کاد الدین لیس من الدین). دێن دەڵێن گەر مەبەستی تەکفیر و دەرچوون لەدین نەبێت، ئەی چی مەبەستێکی هەیە!

ئێوە چاک بزانن سەلەف شەرمن و ترسنۆک نەبوون گەر بێتو تەکفیری یەکێک بکەن و بزانن کوفری هەیە بێ منەت بوینە، وەک چۆن "جعد بن درهم" و "جهم بن صفوان" و "بشر المریس"یان بێ شەرم ترس تەکفیر کرد. بۆچی تا ئەمڕۆش نەمان بینی لەدوای مردنی "مریسی" و "جهم" و هاوشێوەکانیان زاناکان بێن کتێب بنوسن بەوەی "بشر المریسی" مەبەستی وانەبووە و "جهم" بەمشێوەیە خەراپ نەبووە واتە بێن و وەک "إبن عبدالبر" و "إبن التیمیە" و ئەمثالەکانی دیفاعی لێبکەن. لەبەرئەوەی کافربوون ولا کرامە. سەلەف رەحمەتی الله یان لێبێت نەترساون لەلۆمەی لۆمەکاران، بۆیە پێویست بەوە نەکات ئەمڕۆ بێن و بڵێن سەلەف ئەم مەبەستەیان هەبووە.

هەروەک بیرهێنانەوە بۆ خوشک و برایانی موسڵمان، ناکرێت من دانە بەدانەی هەموو ئەقوالەکان نەقڵ بکەم، بەڵام ئەوەی گرنگ بوو ئەمانە بوو لەبەرئەوەی کە وترا سەلەف، ناکرێت ئێمە بێین و هەریەک لە سەردەمی تابعین ژیابێت و بڵێین ئەشهەدو قسەکانی تەواون. ئەمانە بۆ ئێمە سەلەفن کە مەشهورن و ئیمام بوون وەک "سفیان" و "ئەوزاعی" و "مالك" و "ئەحمد" و "شافعی" و هاوشێوەکانیان.

وەڵامدانەوەی ئەو ئەقوالانەی کەوا دەڵێن: (إستتيب أبی حنيفه من الكفر مرتين). وەک بیرهێنانەوە بۆ خوێنەر گەر ئەقوالی زەمی هاتبێت لە سەلەفەوە، هەر لە سەلەفەوە دیفاعی لێکراوە لەسەر ئەم قسەیە (إبن عبدالبر) لە کتێبی الانتقاء أئمة الثلاث، نەقڵی دەکاتن بۆمان کە "محمد بن يونس السكديمی" دەڵێت: گوێم لە "عبدالله بن دواد الخريبی" بوو ڕۆژێک کەوا پرسیاری لێکرا، ئەی باوکی "عبدالرحمن معاذ" لە "سفيان الثوری"یەوە دەڵێت گوایە "ئەبو حنیفە" دووجار لە کوفر تۆبەی پێکراوە!

"خريبی" دەڵێت: والله ئەم شتە درۆیە، چونکە لە کوفە "حسن" و "جعفری" کوڕەکانی "صالح"ی لێبووە کەوا لە وەرع و تەقوا نمونەیان دەگمەن بووە و، "ئەبوو حنیفە"ش بەئامادەبوونی ئەوان فتوایان داوە. بۆیە گەربێت و شتێکی ئاوا هەبوایە هەرگیز پێی ڕازی نەدەبوون. هەروەها "خريبی" دەڵێت: من خۆم ماوەیەکی زۆر لە کوفە ماومەتەوە، بەڵام جارێ گوێم لێ نەبووە شتی وا.

منیش دەڵێم ئەمەش نەقڵی قسەی سەلەفە بۆمان لەلایەن "إبن عبدالبر"وە "خريبی" خۆی شاهێدی دەدات بەوەی گوێی لێنەبووە واتە

بیستن (سمع) و، له حەدیثدا بەهێزترین سەنەد سەنەدی بیستن (سمع)ە، بۆیە دەڵێم با خوێنەر خۆی تەحەکوم بکات و بڕیاربدات لەم نێوەدا.

## بابەتی دووەم: مەدحی ئیمامی "أبو حنيفه" لەلایەن سەلەفەوە.

وەک بیرهێنانەوە بۆ خوێنەری خۆشەویست بابەتی "أبو حنيفه" زیاتر لە هەزار ساڵە تەعدیل دەکرێت و دیفاعی لێ دەکرێت، گەر چەند کەسێک هاتبن جەرحیان کردبێت و قسەیان لەسەر کردبێت. ئەوا لەهەمان کاتدا زۆرێک هاتوون دیفاعیان لێکردووە من دەمەوێت خوێنەر بزانێت، کاتێک لەکتێبێک هاتبێت کە قسە بە "ئەبو حنیفە" گوترابێت لەبەرامبەریدا لەچەندان کتێبی تر دیفاع و مەدح کراوە، واتە گەر لە كتاب السنه وخلق الأفعال العباد "سفيان" قسەی پێ وتبێت لە كتاب الأنتقاء "إبن عبد البر" هەمان زانا واتە "سفيان" مەدحی کردووە بەیارمەتی الله ناوی کتێب و زاناکانیش دەخەمەر بەردەستی خوێنەر و، ئەوەی بۆمن جێگای ئیعتبارە زانایان لەهەر چوار مەزهەبەکە هاتوون دیفاعیان لێکردووە، واتە مالکییەکان و شافعییەکان و حەنبەلییەکان و

خودی حەنەفیەکان. ئەم شتە زۆر هەڵدەگرێت گەر یەکێک کافربێت مەعقول نییە هەر چوار مەزهەب بێن دیفاعی لێبکەن!

یەکێک لەزاناکانی سەلەف کە لە ساڵانی ٣٦٨ هیجری لەدایک بووە و یەکێکە لە زانا دیارەکان "إبن عبدالبر"ە کە زانایەکی مالکی مەزهەبە کتێبێکی تایبەتی داناوە بۆ ئەم شتە بەناوی (الأنتقاء فی فضائل ثلاثة ئئمة الفقهاء) مالکی و شافعی وحەنەفی رضی الله عنهم، واتە ڕەحمەتی بۆ "ئەبو حنیفە" ناردووە و بەپێشەوای داناوە لەم کتێبە، چەندان ئەقوالی زانایانی سەلەفمان بۆ نەقڵ دەکات بەسەنەدەوە.

## یەکەم: "مسعر بن کدام"

کە ناوی تەواوی "أبو سلمة مسعر بن كدام بن ظهير بن عبيدة بن الحارث الهلالي الكوفي" توفي: ١٥٣ هـ/ ٧٢٢ م، شيخ العراق وأحد رواة الحديث النبوي.

یەکێکە لە زانا بەرزەکانی سەلەف لەسەردەمی "ئەبو حنیفە" ژیاوە و سەلەف بە حوججە و جێی متمانە (ثقە) و ئیمامیان داناوە. "إبن عبدالبر" بەسەندی نەقڵی کردووە لە "مسعر بن کدام" لە "عبیدالله بن

موسی"وه دەڵێت گوێم لە "مسعر"بوو دەیفەرموو رحمه الله أبا حنيفه إن كان لفقيها عالما.

منیش دەڵێم ئەوەتا هەر خودی سەلەف ڕەحمەتیان بۆناردووە!

## دووەم: "ئەیوب السختیانی"

یەکێکە لەزانا و پێشەوایانی سەردەمی سەلەف و سەردەمی "ئەبو حنیفه"، "إبن عبدالبر" له كتاب الأنتقاء بەسەنەدێک بۆمان نەقڵ دەکات لە "حماد بن زيد" دەڵێت "ئەیوب السختیانی" پێی وتم، پێم ڕاگەیشتووە کە فەقیهی ئەهلی کوفە واتە "ئەبو حنیفه" بەنیازە بچێتە حەج، گەر بینیت سەلامی منی پێ بگەیەنە.

دەی منیش دەڵێم گەر کافر بێت و گومڕا بێت بۆ سەلەف ئاوا ڕێزیان لێگرتووە.

## سێیەم: "ئەعمش سلێمان بن مهران"

یەکێکە لە زانا و پێشەوا دیارەکانی سەلەف و لەسەردەمی "ئەبو حنیفه" ژیاوە "إبن عبدالبر" دوو قەولی "سلیمان بن مهرانمان" بۆ نەقڵ دەکات بەسەنەدی خۆی دەڵێت: "ئەعمش" دەرچوو بەمەبەستی

حەجکردن کاتێک گەیشتە (الحیرة) بە "علی بن مسهری" گوت بڕۆ لای "أبو حنیفە" تا مەناسیکی حەجمان بۆ بنوسێت.

کەواتە منیش دەڵێم گەربێت و گومڕا و کافر بوایە بە چی شێوەیەک زانایەکی وا گەورەی وەک "الأعمش سلیمان بن مهران" ئەم داوایە دەکات!

## چوارەم: "شعبة بن الحجاج"

"شعبە" یەکێکە لەزانا دیارەکانی سەلەف بەتایبەت لە حەدیث کە بە "شعبە" دەوترا ئەمیر المؤمنین فی حدیث. "إبن عبدالبر" بەسەنەدێک بۆمان نەقڵ دەکات لە "عبدالصمد بن عبدالوارث"ەوە دەڵێت: ئێمە لای "شعبة بن الحجاج" بووین هەواڵ هات کەوا "ئەبو حنیفە" مردووە "شعبە" دەڵێت: بەڕاستی فەقیهی کوفە ڕۆیشت کە الله فەضڵی بە ئێمە و ئەویش بەخشیبوو بەڕەحمەتی.

منیش دەڵێم گەربێت گومڕا و کافر بوایە بەچی شێوەک زانایەکی ئەتباعی تابعینی وەک "شعبە" وای پێ دەڵێت!

## پێنجەم: "سفیان الثوری"

ئیمام و پێشەوای سەلەفە، وەک وتم گەر لە کتێبێک ئەقوالی زەمی هێنرابێت ئەوا لەکتێبێکی تر لە خودی هەمان زانای سەلەف مەدحی هێنراوە، یەکێک لەمانە "سفیان الثوریە" کە "إبن عبدالبر" لە الأنتقاء أئمة الثلاثة چوار قەولی "سفیان"مان بۆ نەقڵ دەکات بەسەنەدی خۆی لە "عبدالله بن داود الحرمی"یەوە دەڵێت: من لای "سفیان" بووم یەکێک پرسیاری لە پرسیارەکانی حەجی لێکرد و ئەویش وەڵامی دایەوە وتی، بەڵام "ئەبو حنیفە" وادەڵێت "سفیان" فەرمووی، کەواتە بەمشێوەیە کە "ئەبو حنیفە" دەیڵێت.

بۆیە منیش دەڵێم گەربێت و کافر و گومڕا بوایە چۆن ئیمامێکی وەک "سفیان" تەصدیقی قسەی "أبو حنیفە" دەکاتن!

### شەشەم: "سفیان بن عیینە"

یەکێکە لە ئەتباعی تابعین و زانا و پێشەوای حەدیثە کە "إبن عبدالبر" لە (الأنتقاء أئمة الثلاثة) زیاتر لە پێنج قەولی ئەومانی بۆ نەقڵ کردووین. یەکێک لەوانە دەڵێت یەکەم کەس لە کوفە کە لای دانیشتم لە حەدیث "أبو حنیفە" بوو.

هەروەها قەولێکی تری دەهێنێت لە "سفیان بن عيينه"وە دەڵێت: "ئەبو حنيفه" کەسێکی خاوەن مروئەت و نوێژ بوو ئەمە زیاتر مەدحە لە عیبادەت و ورعی "ئەبو حنیفه".

## حەوتەم:

بۆئەوەی باسەکە درێژ نەبێت دانە بە دانەی قەولەکانیان نەقڵ ناکەم، بەڵام با خوێنەر بۆ سیقە بگەڕێتەوە سەر ئەم کتێبە کە ئاماژەم لە بۆیکردووە لەسەرەوە وەک "حماد بن زيد" و "يحيى بن سعيد القطان سعيد بن أبی عروبه" و "إبن شبرمه" و، (تەنانەت "إبن جريج" کە "روح بن عباد" دەڵێت: لای "إبن جريج" بووم هەواڵ هات کە "ئەبو حنیفه" مردووە فەرمووی ڕەحمەتی اللەی لێبێت عیلمێکی زۆری لەگەڵ خۆی برد).

بۆیە منیش دەڵێم گەر کەسێکی کافر و گومڕا بوایە بەچی شێوەیەک ڕەحمەتی بۆ دەنارد! هەروەها مەدحی ئیمامی "شافعی"ش نەقڵ دەکات بەوەی دەڵێت: من أراد الفقه فهو عيال على أبی حنيفه.

بۆیە دەمەوێت بەخوێنەر بڵێم ئەمانە هەمووی مەدحی خودی زانا گەورە و پێشەواکانی سەلەف و سەردەمی "ئەبو حنیفه"بووە کە بۆم نەقڵ

کردن ئەوانەی تەکفیری دەکەن دەڵێن ئەمانە هەمووی لاوازە باشە یەک لاواز دوو لاواز سێ و چوار و دە! تا ئێرە تەنیا مەدحی سەلەف بوو.

**هەشتەم:**

لێرەدا بەکورتی کەمێک لەو ئەقوالانەی سەلەف دەهێنم بۆ خوێنەر لە کتاب تأريخ البغدادی لەلایەن "خطيب البغدادی" کە یەکێکە لەزاناکان و حافظەکانی فەرمووده. "خطيب البغدادی" بۆمان نەقڵ دەکاتن لە تأريخ بەژمارە ١٣_٣٣٤ دەڵێت: "ئەبو حنيفه" چووە لای "جعفر منصور" ئەمیری ئیمانداران پێی وت زانستت لەکێ وەرگرتووە، فەرمووی لە "حماد عن ئيبراهيم عن عمر بن الخطاب" و لە "على بن ئەبى طالب" و "عبدالله بن مسعود" و "عبدالله بن عباس"، جعفر دەڵێت: بخ بخ، ئەهلی بیتی پاک و خاوین سەلات و سەلامی اللهیان بەسەردا برژێت.

"خطيب" بۆمان نەقڵ دەکاتن لە "ئەبى وهب بن مزاحم"ەوە دەڵێت: گوێم لە "عبدالله بن مبارک" بوو دەیگوت گەر الله بە "سفيان" و

"أبوحنيفه" یارمەتی و کۆمەکی نەکردبام، وەک خەڵکی ئاسایی و نەشارەزا ئەمامەوە.[1]

منیش دەڵێم ئەم قەولە لە چەندین کتێب و سەرچاوە هاتووە و، "خطیب البغدادی" نەقڵی دەکات لە "روح بن عباد" دەڵێت: ئێمە لای "إبن جریج" بووین ساڵی ١٥٠ی هیجری بوو، هەواڵی وەفاتی "ئەبوحنیفە" هات فەرمووی ئای زانست ڕۆیشت.[2]

منیش دەڵێم ئەم قەولە لە الأنتقاء "إبن عبدالبر"یش نەقڵی کردووە. هەروەها "خطیب البغدادی" نەقڵی دەکاتن بەسەنەدی خۆی لە "ضرار بن صرد" دەڵێت: پرسیار لە "یزیدی کوڕی هارون" کرا کامیان زیرەکترن "سفیان" یان "ئەبو حنیفە"؟ دەڵێت: وتی سفیان أحفظ للحدیث وأبوحنیفة أفقه.

هەروەها "خطیب البغدادی" نەقڵی دەکاتن لە "عبدالله بن مبارك" دەڵێت بە "سفیان الثوری"م گۆت ئەی باوکی عبدالله هۆکار چییە نابینم "ئەبو حنیفە" دوورە لە غەیبەتکردن. نەمبیستووە غەیبەتی یەک دوژمنی

---

١ تأریخ البغداد ١٣_٣٣٥

٢ تأریخ البغداد ١٣_٣٣٥

بکاتن. "سفیان" دەڵێت: ئەوە واللە زۆر عاقڵترە لەوەی بەسەری زاڵ بێت و بەهۆی غەیبەت چاکەکانی بڕوات.[3]

"خطیب البغدادی" بۆمان نەقڵ دەکاتن لە تأریخ "علی بن عاصم" دەڵێت: گەر بێت و عەقڵ و زیرەکی "ئەبو حنیفە" بەنیوەی ئەهلی زەوی بەراودکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو.[4]

وقال الحسن بن محمد الليثي: قدمت الكوفة فسألت عن أعبدِ أهلها، فدُفعت إلى أبي حنيفة؛ (تاريخ بغداد للخطيب البغدادي جـ ١٣ صـ ٣٥٣).

"حسنی کوڕی محمدی للیثی" دەڵێت: چوومە کوفە پرسیاری باشترین بەندەم کرد ڕەوانەی لای "ئەبو حنیفە"یان کردم.

ئنجا "خطیب البغدادی" نەقڵی دەکات لە، قال سفيان بن عيينة: رحم الله أبا حنيفة؛ كان من المصلِّين؛ (تاريخ بغداد للخطيب البغدادي جـ ١٣ صـ ٣٥٣).

---

٣ تأريخ البغداد ١٣_٣٦٤

٤ تأريخ البغداد ١٣_٣٦٤

"سفيان بن عيينه" كه ئيمامه و پێشەوايەكی سەلەفە دەڵێت ڕەحمەتی اللهی لێبێت "ئەبو حنيفه" له نوێژخوێنان بوو، واته له عيبادەت و وەرع و تەقوادا.

هەروەها "خطيب البغدادی" نەقڵی دەكاتن، مكي بن إبراهيم (شيخ البخاري): جالستُ الكوفيين فما رأيت أورعَ من أبي حنيفة؛ (تاريخ بغداد للخطيب البغدادي جـ ١٣ صـ ٣٦٣).

"مكی بن ئيبراهيم" كه شێخی بوخارييه دەڵێت: له مەجليسی كوفەييەكان دانيشتووين، كەسم نەبينيووه بەتەقواتر و موتەقی تر بێت له "ئەبی حنيفه".

ڕيوايەتەكان زۆرن نامەوێت هەمووی دانه به دانەيان نەقڵ بكەم، بەڵام دەبێت خوێنەر زيرەكانه بڕياربدات تۆ بڵێی ئەم هەموو ئەقوالەی له سەلەف نەقڵ كراوه لەسەر مەدح و ستايشی سەلەف بۆ "ئەبو حنيفه" هەمووی درۆ و هەڵبەستراو بێت. ئايا دەكرێت زانايان لەچەندان كـێب هەمان ڕيوايەت دووباره بكەنەوه و درۆش بێت!

## بابەتی سێیەم: مەدح و ستایشی خەلەف بۆ ئیمامی "أبو حنیفه".

دوای نەقڵ کردنی ستایشی زانا گەورە و پێشەواکانی سەلەف لەسەر "أبوحنیفه"، دێینە سەر خەلەف ئەمیش لە "إبن تیمیه" و حافظ "مزی" و حافظ "ذهبی" و حافظ "إبن کثیر" بەسەنەد و سەرچاوەی باوەڕپێکراوەوە.

### یەکەم: بۆچوونی شێخ الإسلام "إبن تیمیه" لەسەری.

منهاج السنة (١) ١٧٢/١ و ١٧٣: {... أَئِمَّةِ أَهْلِ الحَدِيثِ وَالتَّفْسِيرِ وَالتَّصَوُّفِ وَالفِقْهِ، مِثْلِ الأَئِمَّةِ الأَرْبَعَةِ وَأَتْبَاعِهِمْ}.

واتە پێشەوایانی تەفسیر و حەدیث و فیقە و تەصەوف چوار ئیمامەکەن.

هەروەها هەر لە منهاج السنة (١) ٢١٥/١ و ٢١٦: {... وَأَئِمَّةُ الإِسْلاَمِ المَعْرُوفُونَ بِالإِمَامَةِ فِي الدِّينِ، كَمَالِكٍ وَالثَّوْرِيِّ وَالأَوْزَاعِيِّ وَاللَّيْثِ بْنِ سَعْدٍ وَالشَّافِعِيِّ وَأَحْمَدَ وَإِسْحَاقَ وَأَبِي حَنِيفَةَ وَأَبِي يُوسُفَ}.

دەڵێت پێشەوایانی ئیسلام کە ناسراون بە ئیمام لەدیندا وەک "مالك" و "سفیان الثوری" و "أوزاعی" و "للیث بن سعد" و "شافعی" و "أحمد" و "إسحاق" و "أبی حنیفه" و "أبی یوسف".

ئنجا هەر لە منهاج السنەدا لەچەند شوێنێکی تر، دان بە ئیمامەتی "أبو حنیفه" دەنرێت. بەڵام لەبەر درێژەدانی بابەت و کتێب هەمووی نەقڵ ناکەم. هەروەها شێخ الإسلام "إبن تیمیه" جگە لە دانانان بە ئیمامەتی، هاتووە دیفاعیشی لێکردووە! کە لەسەرەتای کتێب باسم کرد.

منیش لێرەدا دەڵێم مەعقول نییە زانایەکی وەک "إبن تیمیه" بێت و کەسێکی کافر و گومڕای وەک "ئەبو حنیفه" بکاتە ئیمام و پێشەوا!

## دووەم: ئیمامی "ذهبی"

گەرچی ئەوانەی تەکفیری "أبوحنیفه" دەکەن تەکفیری "زەهبی"ش دەکەن، بەڵام یەکێکە لە حافظ و ئیمامەکانی خەلەف. بەمشێوە لە کتێبەیکەی خۆی بەناوی سیر أعلام النبلاء لە تەرجومەی ژیانی "ئەبو حنیفه" باسی دەکاتن.

الإِمَامُ، فَقِيْهُ المِلَّة، عَالِمُ العِرَاقِ، أَبُو حَنِيْفَةَ النُّعْمَانُ بنُ ثَابِتِ بنِ زُوْطَى التَّيْمِيُّ، الكُوْفِيُّ.

دەڵێت ئیمامی "ئەبو حنیفە" فەقیهـ و زانای عێراق و کوفە بووە. هەروەها لەکتێبەکەی کورتەیەک لەژیانی دەخاتەڕوو و، لەکۆتاییدا دەڵێت باسکردنی "ئەبو حنیفە" پێویستی بەدوو موجەلدە. بەهەمان شێوە چەند قەولێکی مەدحی سەلەف بۆ "ئەبو حنیفە"

نەقڵ دەکاتن، لەوانە قەولی "إبن مبارك" کە پێی دەڵێن، ئایا کامیان لەفیقهـ لەپێشترن مالك یان "ئەبو حنیفە"، ئەوەیش دەڵێت: "ئەبو حنیفە". ئەمە لە سیر أعلام النبلاءدا هاتووە.

قُلْتُ: الإِمَامَةُ فِي الفِقْهِ وَدَقَائِقه مُسَلَّمَةٌ إِلَى هَذَا الإِمَامِ، وَهَذَا أَمرٌ لاَ شَكَّ فِيْهِ. وَلَيْسَ يَصِحُّ فِي الأَذْهَانِ شَيْءٌ ... إِذَا احْتَاجَ النَّهَارُ إِلَى دَلِيْلِ وَسِيْرَتُه تَحْتَمِلُ أَنْ تُفرَدَ فِي مُجَلَّدَيْنِ -رَضِيَ اللهُ عَنْهُ وَرَحِمَهُ-. تُوُفِّيَ: شَهِيْداً، مَسْقِيّاً، فِي سَنَةِ خَمْسِيْنَ وَمائَةٍ.

دانانان بە پێشەوایەتی و زیرەکی و دانایی "ئەبو حنیفە" لەلایەن ئیمامی "زەهبی"یەوە، تەنانەت بە شەهید ناوی دێنێت.

منیش دەڵێم، بۆچی موئەریخ و ناقدێکی گەورەی وەک ئیمامی "زەهبی" بە "ئەبو حنیفە" بڵێت ئیمام و زانا و شەهید ڕەحمەتیشی بۆ بنێرێت. ئەمەشیان بۆ خوێنەر بەجێدەهێڵم.

## سێیەم: ئیمامی "إبن كثير"

یەکێک لەزانا و موفەسیرە بەرز و ناودارەکانی ئیسلامە، کە خاوەنی تەفسیری "إبن كثيرە" بەربڵاوترین تەفسیری ئیسلام. لەکتێبەکەی بەناوی البداية والنهايە، لە ساڵی سەدو پەنجای کۆچی، لە کورتەیەک لەژیانی "ئەبو حنیفە"دا ئاوا باسی دەکاتن:

{وَفَاةُ الْإِمَامِ أَبِي حَنِيفَةَ وَذِكْرُ تَرْجَمَتِهِ} وَفِيهَا تُوُفِّيَ الْإِمَامُ أَبُو حَنِيفَةَ. هُوَ الْإِمَامُ أَبُو حَنِيفَةَ، وَاسْمُهُ النُّعْمَانُ بْنُ ثَابِتٍ التَّيْمِيُّ، مَوْلَاهُمُ الْكُوفِيُّ.

هەر لەسەرەتای باس دەڵێت ئیمامی "ئەبو حنیفە"، واتە داننان بە پێشەوایەتی و زانایی "ئەبو حنیفە". جگە لە بە ئیمام دانانی، زیاتر مەدح و ستایشی دەکاتن وەک:

فَقِيهُ الْعِرَاقِ، وَأَحَدُ أَئِمَّةِ الْإِسْلَامِ، وَالسَّادَةِ الْأَعْلَامِ، وَأَحَدُ أَرْكَانِ الْعُلَمَاءِ، وَأَحَدُ الْأَئِمَّةِ الْأَرْبَعَةِ أَصْحَابِ الْمَذَاهِبِ الْمُتَّبَعَةِ، وَهُوَ أَقْدَمُهُمْ وَفَاةً.

فەقیهی عێراق و یەکێک لە پێشەوایانی ئیسلام....

ئەوەی جێی ئیعتیبارە بۆمن ئیمامی "إبن کسیر" دوای مەدح و ستایشی و بە ئیمام دانانی و ئەقوالی مەدحی سەلەفیش بۆمان نەقڵ دەکاتن، وەک:

قَالَ يَحْيَى بْنُ مَعِينٍ: كَانَ ثِقَةً، وَكَانَ مِنْ أَهْلِ الصِّدْقِ، وَلَمْ يُتَّهَمْ بِالْكَذِبِ، وَلَقَدْ ضَرَبَهُ ابْنُ هُبَيْرَةَ عَلَى الْقَضَاءِ فَأَبَى أَنْ يَكُونَ قَاضِيًا.

ئەمە لە سیر أعلامی ئیمامی "زەهبی" و "الأنتقائی إبن عبدالبری"ش هاتووە، کە "یحیی بن معین" ستایشی دەکات و بە جێی متمانە (ثقة) و ئەهلی چاکە وەسفی دەکاتن.

وَقَدْ كَانَ يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ يَخْتَارُ قَوْلَهُ فِي الْفَتْوَى، وَكَانَ يَحْيَى يَقُولُ: لَا نَكْذِبُ اللهَ، مَا سَمِعْنَا أَحْسَنَ مِنْ رَأْيِ أَبِي حَنِيفَةَ، وَقَدْ أَخَذَ بِأَكْثَرِ أَقْوَالِهِ.

هەروەها "یحیی بن سعیدی"ش دەڵێت درۆ ناکەم واللە تائێستا وەک رەئی "ئەبو حنیفە"ی چاکم گوێ لێنەبووە و زۆرێک لە قەولەکانی وەردەگرێت.

وَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ الْمُبَارَكِ: لَوْلَا أَنَّ اللهَ أَغَاثَنِي بِأَبِي حَنِيفَةَ وَسُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ لَكُنْتُ كَسَائِرِ النَّاسِ.

"إبن مبارك" دەڵێت: گەر الله یارمەتی نەداباما بە "ئەبو حنیفە" و "سفیان الثوری"، ئەوا من وەک خەڵکێکی ئاسایی بووم. ئنجا قەولی "شافعی"ش نەقڵ دەکاتن و مەدحی "مالك بن أنس"یش نەقڵ دەکاتن بۆ درێژ نەبوونی باسەکە دانە دانەی نەقڵ ناکەم.

منیش بەخوێنەر دەڵێم ئەوانەی تەکفیری "ئەبو حنیفە" دەکەن و بەگومڕای دادەنێن و ئەم مەدحانەی سەلەفیش بە لاواز دادەنێن، دەڵێم مەعقول نییە لەم هەموو کتێبەی وەک البدایە والنهایە و سیر أعلام النبلاء و الأنتقاء الأئمة الثلاث، هەمان قەول دووبارە بۆتەوە. خوێنەری بەڕێز ببینە کاتێک خەلەف هاتوون مەدحی "ئەبو حنیفە"یان کردووە و بە ئیمام دایانناوە، ئەوان پاڵپشت بە ئەقوال و مەدحی سەلەف بوونە! بۆیە خوێنەر دەبێت بزانێت ناکرێت کەسێک کافر و گومڕابێت، کەچی سەلەف و خەلەف و زۆرینەی زانا و پێشەوایانی دین بێن و بە ئیمامی دابنێن.

## چوارەم: حافظ " أبو الحجاج المزی "

یوسف بن عبد الرحمن بن یوسف، أبو الحجاج، جمال الدين ابن الزكي أبي محمد القضاعي الكلبي المزي (المتوفى: ٧٤٢هـ).

"أبو الحجاج المزی" یەکێکە لەزانا گەورەکان، هەروەها حافظ لە حەدیث و هاوڕێی شێخ الإسلام "إبن تیمیە" بوو. کاریگەربوون پێکەوە، لە یەک سەردەم و یەک سەدە ژیاون، بەڵام چواردە ساڵ دوای وەفاتی شێخ الإسلام دەمرێت لە کتێبە بەنرخ و گرانبەهاکەی بەناوی (تهذیب الکمال في أسماء الرجال) کە بەسەرداری مەنهەجی موتەئەخرین لە جەرح و تەعدیل و مەعریفە الرجال دادەنرێت، لە باسی ژیانی "ئەبو حنیفە" پێمان دەڵێت: لە "یحیی بن معین" "ئەبو حنیفە" فەرموودەی نەدەگێڕایەوە تەنیا ئەوانەی لەبەری کردوون. ئنجا لەقەولێکی تر دەڵێت "ئەبو حنیفە" جێی متمانە (ثقة)یە و درۆش ناکات.

هەروەها حافظ "مزی" بەسەنەدی خۆی بۆمان نەقڵ دەکات لە "إبن مبارك"وە دەڵێت: گەر الله بە "سفیان" و "ئەبو حنیفە" یارمەتی نەدابایەم، ئەوا وەک خەڵکی وابووم. مەبەست لە عیلم و زانستە ئەم قەولەش لە زۆرێک لە کتێبەکان بەسەنەدەوە نەقڵ کراوە و هاتووە.

ئنجا حافظ "مزی" بەسەنەدی خۆی نەقڵی دەکاتن بۆمان لە "حجر بن عبدالرحمن"ەوە، دەڵێت: گوترا بە "قاسم بن معن بن عبدالرحمن"، "إبن عبدالله مسعود" ئایا ڕازی دەبیت ببێتە غولمانێک لای "ئەبو

حنیفه"؟ دەڵێت: فەرمووی لای هیچ یەکێک لەخەڵک دانەنیشتووم کەوا مەجلیسەکانی سودمەندبێت وەک ئی "ئەبوحنیفە".

هەروەها حافظ "مزی" بەسەنەدی خۆی نەقڵی دەکاتن بۆمان لە "روح بن عباد"ەوە، دەڵێت: لای "إبن جریج" بووین، هەواڵی مردنی "ئەبوو حنیفە" هات. دەڵێت دڵی تەنگ بوو فەرمووی (أی ذهب علم).

ئەم قەولە لە چەندان کتێب هاتووە، منیش هەموویم نەقڵ کردووە کەچی دێن و دەڵێن ئەمانە هەمووی لاوازن!

حافظ "مزی" بەسەنەدی خۆی بۆمان نەقڵ دەکاتن لە "عبدالله بن مبارك"ەوە فەرمووی، (رأیت أعبد الناس ورأیت أورع الناس ورأیت أعلم الناس ورأیت أفقه الناس).

واتە أعبد لەبەندایەتی و خواپەرستی کەسێکە کە دەڵێت "عبدالعزیز بن داود" بوو. هەروەها أورع الناس واتە کەسێکی موتەقی و لەخواترسی لە پلەی ئیحسانە، کە دەڵێت "فضیل بن عیاض" بوو. ئنجا أعلم الناس لەزیرکی و ژیری و عیلمدا، کە دەڵێت "سفیان" بوو، أفقه تێگەیشتووترین کەس و وردترین "حنیفە" بوو. دەڵێت: کەسم نەبینیووە لەو فەقیهـ تربوو بێت واتە "ئەبو حنیفە".

ئنجا حافظ "مزی" له تهذیب الکمال بەسەنەدی خۆی له "عبدالله بن مبارك"ەوە دەڵێت: گەر "سفیان" و "ئەبو حنیفه" له یەک شت و فتوادا کۆک بوون ئەوا بەهێزە. ئەمەش پێدا هەڵدانە بۆ "ئەبو حنیفه".

هەروەها حافظ "مزی" بۆمان نەقڵ دەکاتن بەسەنەدی خۆی له "محمد بن بشر" دەڵێت: ئیختلاف لەشتێک لام دروست بوو، چوومەلای "ئەبو حنیفه" پێی ووت لای کێوە هاتوویت بۆ لای من؟ پێم گۆت لەلای "سفیان"وە هاتووم. دەڵێت: پێی گوتم لای کەسێک هاتووی گەربێت و علقمه و أسود ئامادەبوایەن پێویستت پێیان نەبوو و، چوومە لای "سفیان"، وتم لای "ئەبو حنیفه"ەوە هاتووم. پێی گوتم لای (أفقه أهل الأرض) هاتووی، واته تێگەیشتووترین کەس.

دیسان حافظ "مزی" له تهذیب الکمال نەقڵی دەکات بەسەنەدی خۆی له "عبدالله بن داود الخریبی"ەوە دەڵێت: پێویسته لەسەر خەڵکی ئیسلام، واته موسڵمان له هەموو نوێژەکان دوعا بۆ "ئەبو حنیفه"

بکەن. بۆشمان نەقڵ دەکاتن له "شداد بن حکیم" دەڵێت: کەسم نەبینیووە هێندەی "ئەبو حنیفه" زاناتر بێت.

حافظ "مزی" له تهذیب الکمال نەقڵی دەکاتن له "مکی بن ئیبراهیم"ەوه که دەڵێت "ئەبو حنیفه" عالمترین کەسی زەمەنی خۆی بوو.

حافظ "مزی" بۆمان نەقڵ دەکاتن له ئیمامی "شافعی"یەوه که دەڵێت: خەڵکی لەچاو فیقهو تێگەیشتوویی "ئەبو حنیفه" بەلایەک. ئەم قەوله لەچەندان سەنەد و سەرچاوه هاتووه. وەک دەبینن ئیمامی "شافعی" لەجیاتی تەبدیع و تەکفیر هاتووه مەدح و ستایشی کردووه.

بۆئەوەی بابەته درێژ نەبێتەوه هەموو ئەقوالەکان نەقڵ ناکەم. با خوێنەر بۆ ڕاستی ئەم باسه بگەڕێتەوه سەر کتێبی تهذیب الکمال که زیاتر له سی لاپەڕەی بۆ ژیانی "ئەبو حنیفه" تەرخان کردووه، دەیان مەدح و ستایشی زانایانی سەلەفی بۆمان نەقڵ کردووه لەسەر "ئەبوو حنیفه". دەمەوێت خوێنەر ئەوه بزانێت که خەلەف هاتوون نەقڵی مەدح و ستایشی سەلفیان نەقڵ کردووه. بۆیه ئەوانیش دانیان به ئیمامەتی "ئەبو حنیفه"دا ناوه.

ئەوەی بۆمن جێگای ئیعتبارە ئەم کتیبە زیاتر بۆ معرفة الرجال عیلمی حەدیثە، بەڵام نوسەر چەندان لاپەڕەی بۆ تەرخان کردووە و هەمان ئەقوالی کتێبەکانی تر، بەمەش ڕیوایەتەکان یەك بەهێز دەکەن.

## پێنجەم: تهذیب التهذیب "إبن حجر العسقلانی"

یەکێکە لەکتێبەکانی بواری ناسینی رجالی ئیسنادی فەرمودە و، بەتایبەت لە موتەئەخریندا. لەم کتێبەدا لە تەرجومەی ژیانی "ئەبو حنیفە"، حافظ "إبن حجر العسقلانی" هاتووە مەدح و ستایشی سەلەفی نەقڵ کردووە بۆمان. ئنجا با خوێنەر ئەوە بزانێت ئەم زانایەش یەکێکە لەو زانایانەی کە وەک "ئەبو حنیفە" تەکفیر دەکرێتن، چۆن باسی "ئەبو حنیفە" دەکاتن:

وقال صالح بن محمد الأسدي عن بن معين كان أبو حنيفة ثقة في الحديث.

ئەم قەولە لە زۆرینەی کتێبەکاندا هەیە کە لەسەرەتادا هەموویم هێناوە کەوا "یحیی بن معین" دیفاع لە "ئەبو حنیفە" دەکاتن و بە کەسێکی جێی متمانە (ثقة)شی دادەنێت. لەفەرموودە گەرچی زۆرێک لە زانایان بە لاوازیان داناوە. ئنجا هێناویەتی:

وقال أبو وهب ومحمد بن مزاحم سمعت بن المبارك يقول أفقه الناس أبو حنيفة ما رأيت في الفقه مثله.

"عبدالله بن مبارك" دەڵێت: نەمبینیووە وەک "ئەبو حنیفە" فەقیهـ و تێگەیشتوو بێتن.

منیش بەخوێنەری دەڵێم دوبارەبونەوەی ئەم قەولانە لەلایەن زاناکان پاڵپشتی بەهێزی دەکەن، بەڵام ئەمڕۆ دێن و دەڵێن ئەمانە هەمووی لاوازن. هەروەها بۆمان نەقڵ دەکاتن:

وعن بن عيسى بن الطباع سمعت روح بن عبادة يقول كنت عند بن جريج سنة خمسين ومائة فأتاه موت أبي حنيفة فاسترجع وتوجع وقال أي علم ذهب قال وفيها مات بن جريج.

ئەم قەولەی "روح بن عباد" لەزۆرینەی کتێبەکانی تری زانایان هاتووە لەکاتی وەفاتی "ئەبوحنیفە"، "إبن جریج" بۆی دڵتەنگ دەبێت و بەنیگەرانیەوە دەڵێت: عیلم و زانست ڕۆیشت.

ئەوەی جێگای ئیعتیبارە ئەمە دوای وەفاتیەتی، گەر کەسێکی کافر و گومڕا بوایە چۆن وای بۆی دڵتەنگ دەبوو.

هەروەها بەهەمان شێوە "إبن حجر" لە تهذيب التهذيب قەولی "یحیی بن سعید القطان"ی حافظ و ئیمامی "شافعی" نەقڵ دەکاتن لەسەر مەدح و ستایشی سەلەف بۆ "ئەبو حنیفە".

باخوێنەر بزانێت گەر "ئەبو حنیفە" کافر و گومڕا بوایە، بە چی شێوەیەک سەلەف لەجیاتی تەکفیر و لعنەت پێیاندا هەڵداوە و ستایشیان کردووە. هەروەها نەقڵی دەکات لە تهذیب التهذیب:

وقال بن أبي داود عن نصر بن علي سمعت بن داود يعني الخريبي يقول الناس في أبي حنيفة حاسد وجاهل.

"خریبی" کە یەکێکە لە سەلەف لە مەدحی "ئەبو حنیفە"دا دەڵێت: خەڵک لەبەرامبەر "ئەبو حنیفە" حەسود و نەزانن.

ئنجا حافظ "إبن حجر" لە تهذيب نەقڵ دەکاتن بۆمان بەمشێوەیە:

وقال الصغاني عن إبن معين، سمعت عبيد بن أبي قرة يقول، سمعت يحيى بن الضريس يقول: شهدت سفيان وأتاه رجل فقال ما تنقم على أبي حنيفة قال وما له قال سمعته يقول آخذ بكتاب الله فإن لم أجد فبسنة رسول الله فإن لم أجد فبقول الصحابة آخذ بقول من شئت منهم ولا أخرج عن قولهم إلى قول غيرهم فأما إذا انتهى الأمر إلى

إبراهيم والشعبي وابن سيرين وعطاء فقوم اجتهدوا كما فاجتهد كما اجتهدو.

واته "يحيى بن الضريس" دەڵێت: لای "سفيان الثورى" ئامادەبووم پیاوێک هات و پێی وت: بۆچی وا لە "ئەبوحنیفە" دەگەڕێن؟ دەڵێت: لەبەر چی و بۆچی؟ دەڵێت: گوێم لێبووە دەیفەرموو دین لەقورئان وەردەگرم گەر نەبوو، دەچمە سەر سوننەت، واتە فەرموودە گەر نەمدۆزیەوە. بەقسە و ئەقوالی صەحابەکان و لە قسەیان لا نادەم و بچمە سەر کەسانی ترەوە و، گەر گەیشتە "ئیبراهیم" و "شعبی" و "ابن سیرین" و "عطاء" ئەوا ئیجتیهاد دەکەم، وەک چۆن ئەوان ئیجتیهادیان کردووە.

ئەم قەولە "إبن عبدالبری"ش نەقڵی کردووە. بەمەش ڕەدی ئەوانەیە کە ئەمڕۆ دەڵێن کافرە و پێچەوانەی دین جوڵاوەتەوە. وەک پێشووتر باسم کرد کەوا لەسەردەمی ئەودا، وەک سەدەیەک دوای ئەو نەبوو کە هەموو فەرموودەکان هەبن و مەوجود بن.

لەکۆتاییدا باسی "ئەبو حنیفە"دا "إبن حجر العسقلانی" لە تهذیب التهذیب دا بەمشێوە دەڵێت سەبارەت بە "ئەبوحنیفە":

(ومناقب الإمام أبي حنيفة كثيرة جدا فرضي الله تعالى عنه واسكنه الفردوس آمين).

دەڵێت: باسکردن و ستایشی "ئەبو حنیفە" زۆر زیاترە لەوە الله لێی ڕازی بێت و فیردەوسی بڵندی بکاتە نسیب.

## بابەتی چوارەم: بۆچی "أبوحنیفە" پشتی بە قیاس دەبەست؟

زۆرینەی زەمی بەشێک لە سەلەف بۆ "أبوحنیفە" دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی زۆر پشتی بەقیاس دەبەست؟ واتە رای وە رای مقبول نییە لەدین. "إبن عبدالبر" لە کتێبی (الأنتقاء) بەسەنەدی خۆی، نزیکەی حەوت ڕیوایەتی هێناوە لە "أبوحنیفە" بەوەی کە دەیووت گەر فەرموودەی صەحیح هەبێت لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەیخەمە سەرچاوم و، گەر لە صەحابەکان بێتن هەڵیان دەبژێرم و، گەر لە تابعین بێتن ئەوا ئەوان پیاو و ئێمەش پیاو، انتهی. واتە کاتێک تابعییەک قسەی کردبێتن مەبەستی لە ئیجتیهادە. هەر "إبن عبدالبر" بەسەنەدی خۆی نەقڵی دەکاتن لە "زفر بن هذیل" دەڵێت: گوێم لە "ئەبو حنیفە" بوو دەیفەرموو، دروست نییە

بۆ یەکێک کە فتوا لەسەر کتێبەکانی من بدات تا نەزانێت لە کوێوە نەقڵم کردووە و هاتووە، انتهى. واتە ئەستۆپاکی خۆی دەکاتن لەشوێنکەوتنی کوێرانەی.

لە بدایەتدا دەمەوێت پێتان بڵێم ئەم کارەی من واتە ئەم وەڵامانە بۆ پەردەپۆش کردن و شوێنکەوتنی کوێرانە نییە. هەروەها بۆ حاشاکردن نییە لە هەڵەی هیچ یەکێک و، بۆ ناشرین کردنیش نییە. تەنیا ئامانجم ڕوونکردنەوەی ڕاستییەکانە لەسەر سەلەف و خەلەف و "أبوحنیفە" و زانایانی تر، چونکە نەخۆشییەکی زۆر کوشندەیە ئەگەربێت جەهلت لەم باسانە هەبێت.

دەقی وەڵامی پێنجەم وەک بیرهێنانەوە بۆ ئیمانداران، ئەوانەی کەمێک مەعلوماتیان لە عیلمی حەدیث هەبێت دەزانن کەوا چۆن بووە و چۆن نەبووە. واتە "أبوحنیفە" لەسەدەی یەکی هیجری و ساڵانی هەشتایی هیجری لەدایک بووە، واتە حەفتا ساڵێک دوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ. بەشێک لەزانایان پێیان وایە تابعی بووە لەبەرئەوەی چەند هاوەڵێکی بینیووە. لەزەمەنی "أبوحنیفە" هەموو فەرمودەکان وەک ئەمڕۆ ئاوا لەبەردەست نەبوون تەنانەت ئەوکات موطأی ئیمام "مالك"یش

نەبوو، بۆیە گەر فەرموودەیەکی لەبەر چاوان بێت سەمع و طاعەی بۆ هەبووە، گەرنا ناچار قیاسی لەسەر کردووە. جگە لەمەش ئەو زەمەن ئیسنادی فەرموودە و ناسینی رجالی فەرموودە وەک ئەمڕۆ نەبوو، هەر نەبوو دواتر لەسەردەمی دوای ئەم، بەتایبەت دوای ئیمامی "شافعی" زۆر پەرەی سەند.

ئەم شتەی دەیڵێم حەقە و ڕاستییە هەریەک کەمێک لە زانستی فەرموودە شارەزابێت باش دەزانێت کە ڕاستە. بۆیە سەلەفیش زۆرینەی زەمیان لەسەر ئەمە بووە، بەمەش بۆی دەبێتە عوزر. ڕەحمەت لە سەلەفیش بێت کە وەک ئەم هەرزەکارانەی ئەمڕۆ توندنەبوون، بۆنمونە "سفیانی ثوری" کاتێک "أبوحنیفە" دەبینێت تەنیا ڕووی لێ وەردەگێڕێت، ئەم قەولە لە کتاب السنەی "عبداللە بن احمد" هەیە. بۆی نەچووە بڵێت هەی کافری زەندیق و مورتەد، سەلەف هەزار ڕەحمەتیان لێبێت.

هەروەها زۆرێک لەوانەی تەکفیری "ئەبو حنیفە" دەکەن دەڵێن ئەوەتا "إبن أبی شیبە" رحمە اللە کتێبێکی تایبەتی داناوە لە مەصنفەکەی، کەوا دەیان فەرموودە دەهێنێت کە "ئەبوحنیفە" پێچەوانەی کردووە. هەر

لەسەرو تر ئاماژەم بەقەولی خودی "ئەبو حنیفە" کرد کە دەڵێت گەر فەرموودەی ئیسناد صەحیحم لەبەردەست بێت، دەیخەمە سەرچاوم. ئەمە هەر خودی بنەبڕکردنی قسەکانیانە، وەک بیرهێنانەوە "إبن أبی شیبە" نزیکەی سەدەیەک دوای "ئەبو حنیفە" هاتووە، واتە لەساڵانی دووسەد و سێ و پێنجی هیجری وەفاتی کردووە. بەڵام "ئەبو حنیفە" لەساڵی ١٥٠ی هیجری وەفاتی کردووە. سەردەمی "إبن أبی شیبە" هەموو فەرموودەکان لەبەردەست بوون و پیاوی حەدیث و عیلمی رجال و ئیسناد لەمەیدان بوون، بۆیە ئەمەش بۆی دەبێتە عوزر بەیارمەتی الله. هەروەک شێخ الأسلام "إبن تیمیە" دەڵێت: هەریەک واگومان ببات کەوا "ئەبو حنیفە" و یەکێک لەپێشەوایانی موسڵمانان غەیری سوننەی صەحیح بجوڵێن، ئەوا هەڵەی کردووە و هەڵە بڕیاری داوە یان بە گومان یان بە هەوا و هەوەس، انتهی. با خوێنەر خۆی تەحەکوم بکات لەنێوان ڕووداوەکان.

## بابەتی پێنجەم: دانانی "أبو حنيفه" وەک ئیمام لەلایەن "محمد بن عبدالوهاب"ەوە.

هەروەها لەدوای ئەمانە هەریەک لەشێخی موجەدید و نوێکەرەوەی تەوحید "محمد بن عبدالوهاب" پاڵپشت بەو بەڵگانەی لە سەلەف دەربارەی "ئەبو حنیفە" نەقڵ کراوە دان بە ئیمامەتی و پێشەوایەتی "ئەبوو حنیفە"دا دەنێت. بۆیە پێویستە خوێنەر بزانێت کاتێک دەڵێین خەلەف، ئەم زانایانەیان بەئیمام داناوە بێ بەڵگە نەبووە و بەجەهل نەبووە، بگرە ئەوان زۆر لەمن و تۆ شارەزاترن بەحاڵی سەلەف. بۆیە بەئینصاف و دوور لە تەعەصوب هاتوون یەکلاییان کردووەتەوە، هەروەها لە سیلسیلەی مەنهەجی دەوڵەتی خەلافەی ئیسلامیش هاتووە و ئیعلان کراوە کەوا دان بەئیمامەتی "ئەبو حنیفە"دا دەنێن. هەروەها داوای لێخۆشبوونی لە الله بۆ دەکەن. تەنانەت هەریەک لەزاناکانی وەک "نووی" و ئیمامی "ذهبی" و "إبن حجر" و "إبن حزم" بەزانا دادەنێن و داوای لێخۆشبوونی لە الله بۆ دەکەن.

من دوای دیراسە و بەدواداچوون لەسەر بابەتی "ئەبوو حنیفە" دوای دەیەها بەڵگەی نەقڵ کراوی سەلەفم بینی لەسەری، زیاتر بۆم

ڕوونبووەوە کەوا مەنهەجی خەلەف واتە "إبن تیمیە" و "محمد بن عبدالوهاب" و خەلافەی ئیسلامی هەمان مەنهەجی سەلەفە.

ئنجا باخوێنەری عەزیز بزانێت هیچ و کەس و لایەن و زانایەک مەعصومی هەڵە ناکەین و قەولی بە موطڵەقی ناهێنین و نایکەین بەدین و فەرزی بکەین بەسەر خەڵکدا. بەڵام کاتێک دەبینین و دەبینم دەڵێن مەنهەجی خەلەف پێچەوانەی سەلەفە و لەم باسەدا نەیان پێکاوە، ئەوا بۆمن زۆرگران ڕادەوەستێت.

با خوێنەر چاک بزانێت گەربێت بۆمن ڕوون بایەتەوە وەک کە "ئەبو حنیفە" کافر و گومڕایە وەک چۆن ئەمڕۆ دێن و جنێو سوکایەتی پێ دەکەن، واتە کافر بووایە و لەم لاوەش خەلەف هاتوون کردوویانەتە ئیمام و پێشەواو ڕەحمەتی لە بۆ دەنێرن و دیفاعی لێدەکەن. ئەوا بۆ هەتا هەتایە یەک قەولی "إبن تیمیە"م نەدەهێنا و ژیاننامەشم نەدەخوێندوە و بەرائەتیشم لێدەکرد بۆ هەتا هەتایە. بە "زەهەبی"م نەدەگوت ئیمام و هەڵدەستام تەفسیری "إبن کثیر"م دەردەهێنا لە مەکتەبەکەم و مجموع فتاوەیم فڕێ دەدا و کتاب توحید و فتح المجیدم هەر باس نەدەکرد کە "محمد بن عبدالوهاب" نوسیوویەتی و بەرائەتیشم لە مەنهەجی

خەلافەی ئیسلامیش دەکرد! دەزانن لەبەرچی؟ لەبەرئەوەی هاتوون کافر و گومڕا و زەندیقێکیان کردووە بە ئیمام و دیفاعی لێدەکەن. بەڵێ ئەوە ڕاستیەکەیە دەبێت ئاوای لێبێت چۆن دەکرێت کافر و مورتەد بکرێتە ئیمام وەک ئەوەیە بڵێین "ئەبو جهل" ئیمامە پەنا بە الله! ئایا ڕێی تێدەچێت زانایەک کافرێکی پێ ئیمام بێت و بڵێین زانایە؟ نەخێر واللە، دەی کەواتە بابەتی خیلافی و لاوەکی نییە. ئەم باسە مەنهەج و عەقیدەیە واتە بناغە، بناغەش تەواو نەبێت سوودی نییە (دەڵێن ئاساییە بالەم شتە نەیان پێکابێت). منیش دەڵێم ئەمە گەورەترین شتە گەر ئەوان لەوە نەیانپێکابێت، واتە لەهیچ نەیان پێکاوە ئەوان گەر وابێت لەعەقیدە و مەنهەج نەیان پێکاوە. دەزانن واتای چییە؟ واتای پێچەوانەی مەنهەجی حەق مەنهەجی باطلە کە من لێرەوە ڕایدەگەیەنم ئەم زانایانە مەبەستیان پێکاوە لەم باسەدا. هەروەها مەنهەجیان هەمان مەنهەجی سەلەفی ئێمەیە لایان نەداوە وەک چۆن ئەمڕۆ دێن دەڵێن مەنهەجی سەلەف و خەلەف جیاوازە لەگەڵ یەکدا، بەڵام ئەوەیان تەنها گومان و بوختانە بۆیان.

بۆئەوەی خوێنەر زیاتر لای ڕوون بێتن مەرج نییە ئەوەی نەقڵ کرا و گوترا حەق و ڕاستبێتن. ئەمیش نمونەیەک لەنێوان مامۆستا و قوتابی لەسەردەمی سەلەفدا کە ئیمامی "بوخاری" و شێخەکەیەتی.

"یحیی بن محمد الذهلی" یەکێکە لەزانا گەورە و پێشەواکانی سەلەف لە حەدیث مامۆستا و شێخی هەریەک لە "بوخاری" و "موسلم" و "ترمزی" و "أبوداود" چەندان پێشەوای تر بووە. هەروەها ئەم زانایایە لەساڵی ١٧٢ هیجری لەدایک بووە، واتە پێشینەیە و سەلەفە بۆمان. ئەمە زانیمان کێیە دوای گەڕانەوەی ئیمامی "بخاری" بۆ خاکی خۆی ئەم شێخە بەقوتابیەکانی دەڵێت: بڕۆنە لای و لەمەجلیسەکانی دابنیشن، بەڵام دواتر حەسادەت چاوی کوێر دەکات و وا بڵاودەکاتەوە کەوا ئیمامی "بخاری" دەڵێت: قورئان مەلخوقە.

وەک بیرهێنانەوە بۆ ئیماندار هەریەک بڵێت قورئان مەخلوقە، سەلەف بەکافریان دەزانی بەمەش واتە تەکفیری ئیمامی "بوخاری"یان کرد، تا وای لێهات کەس لەدەوری نەما و شاربەدەر بوو. ئنجا بەغەریبی وەفاتی کرد، تەنانەت بەهۆی ئەم قەولەی مامۆستاکەی ئیمامی

"بوخاری" زۆرێک لەزانا و پێشەوایانی ئەو کات فەرموودەیان لێوە نەقڵ نەکرد، لەبەرئەوەی وابڵاوکرایەوە کە دەڵێت قورئان مەخلوقە.

نامەوێت بچمە نێو وردەکاری زیاتر، بەڵام ئەم بەسەرهاتە حەق و ڕاستییە و لەسەرچاوەکان هەیە لەسەرووی هەموو ئەمانە چۆن وەسفی دەکرێت لەلایەن زانایان بەمشێوەیە:

- قال الخطيب البغدادي: كان أحد الأئمة العارفين والحافظ المتقنين والثقات المامونين صنف حديث الزهري وجوَّده وقدم بغداد وجالس شيوخها وحدث بها.
- وكان أحمد بن حنبل يثنى عليه وينشر فضله.
- وقال الذهبي: الإمام، العلامة، الحافظ، البارع، شيخ الإسلام، وعالم أهل المشرق، وإمام أهل الحديث بخراسان.
- وقال الحاكم النيسابوري: إمام أهل الحديث في عصره بلا مدافعة.
- وقال ابن أبي حاتم: سئل أبي عنه فقال: ثقة.
- وقال أبو زرعة: «هو إمام من أئمة المسلمين.

ئەمە مەدحی ئەم زانایەیە، واتە "یحیی الذهلی" لەکاتێکدا تەکفیری ئیمامی "بخاری" کرد و بوختانی ئەوەیان بۆ کرد کە دەڵێت قورئان مەخلوقە!!

هەردووکیان سەلەف بوون و مامۆستا و قوتابی بوون. بۆیە نابێت هیچ کەس بە مەعصوم سەیر بکرێت باسەکەشم لەسەر "ابوحنیفە"یە، گەر چەند کەسێک زەمیان کردبێت، زۆرێک بێدەنگ بوون و دواتر مەدحیان کردووە. هەروەها پێشەوا هەرە دیارەکانی سەلەف تەکفیریان نەکردووە، وەک ئیمامی "مالك" و ئیمامی "شافعی" و ئیمامی "أحمد" واتە هەرسێ پێشەواکە. جگە لەمەش زۆرینەی زۆری دواتر وەک سەرداری خەلەف تەعدیلیان کردووە و ڕەحمەتیان بۆ ناردووە. بۆنمونە گەر ئێمە بچین نەقڵی ئەقوالی "یحیی الذهلی" شێخی "بخاری" بێنین لەسەر "بخاری" ئەوا دەڵێین ئیمامی "بخاری" جەهمی بووە و کافر بووە، لەبەرئەوەی گوتوویەتی قورئان مەخلوقە، بەڵام ڕاستییەکەی شتێکی ترە. کەواتە لێرەدا ئێمە گەر تەنیا نەقڵی قەولی سەلەف بکەین لەسەر "بخاری" ئەوا دەڵێین "بخاری" جەهمی بووە و گومڕا بووە. بەڵام ڕەحمەتی الله لە زاناکانی خەلەف کە هاتوون عادیلانە و بە ئینصاف

ڕاستییەکانیان نیشانداوە و پاکانەیان بۆ "بخاری" هێناوەتەوە و لەم بوختانە ڕزگاریان کردووە.

با خوێنەری عەزیز کەمێک ژیر بێتن ئایا ڕاستییەکە بەلای کێدایە.

## لەکۆتاییدا

وەک بیرهێنانەوە بۆ خوێنەری عەزیز "جعد بن درهم" و "جهم بن صفوان" و "بشر بن غياث المريسى" لەسەردەمی سەلەف ژیاون. ئەمانە هەریەکە و یەکێک بووە لە پێشەوای گومڕاکاران "جعد" و "جهم" بابەتی قورئان مەخلوقە و ئەم شتانەیان داهێناوە. "بشر المريسى" تەعطیلی چەندان سیفەت دەکاتن. بەپووختی ئەمانە وەک چۆن "ئەبو حنیفە" ژیاوە، ئەوانیش لەهەمان سەردەم ژیاون و هەر ئەو کات و دوای ئەوانیش سەلەف هاتوون کتێبیان لە دژیان دەرکردووە و بە زەندیق و کافر ناویان بردوون. وەک الرد على الجهميەی ئیمام "احمد". ئنجا سەلەف لەکاتی ناوهێنانی ئەمانە لەعنەتەیان لێکردوون بێ دوو دڵی مورتەد و زەندیقیان کردوون بەتێکراو بە ئیجماعی سەلەف.

هەروەها تا ئەمڕۆش و بەم کاتەشەوە لەدوای سەلەف، هیچ یەکێک لەزانایانی مەشهوری خەلەف نەهاتوون کتێب بنوسن و بێن تەعدیلی ئەوانە بکەن و، بڵێن ئەوانە ئیمامن. بۆچی؟ لەبەرئەوەی کافربوون و گوومڕابوون. بەڵام دەبینین هەر لەسەلەفەوە تائەمڕۆش کتێب بۆ تەعدیلی "ئەبو حنیفە" دەنوسرێت و، دوای سەلەف زۆرینەی زانا مەشهورەکانی خەلەف هاتوون دیفاعیان لێکردووە و ڕەحمەتیان لەبۆی ناردووە. بۆیە چیتر بەهەموو قسە و گوفتارێک مەخەڵەتێن و تەکفیری بەناحەقی زانایان مەکەن. ئێمەش دەڵێین تەکفیر حەقە، بەڵام بۆ کەسی خۆی.

داواکارم لە الله کەوا ڕێگامان ڕۆشن بکاتن و حەقمان لەلا شیرین بکاتن و بمانکاتە شوێنکەوتەی حەق و مەنهەجی حەق.

**والحمد لله رب العالمين**